# هەزار دیوانی کەڵەگەت لە پرسەدا

شێعر

سالح سووزەنی

١٩٩٥

هەزار دیوانی کەڵەگەت لە پرسەدا

شێعر

ساڵح سووزەنی

چاپی‌یەکەم ـ ساڵی ١٣٧٨

تیراژ : ٢٠٠٠

پیتچن:

رووبەرگ : رێبوار سەعید

PDF 4 KURD

## پێرست

جەحانم رم

و

و

خا...

بە سەر باخی بەهەشتا...

ئاگر وتی:

پشکۆکانم لە ناو سینگا هەڵپڕووکان

کەچی شەختە،

ئاوڕێکی لێ نەدامەوە!

سڵاو لە ئەویندارانی هەتاو، وڵات

ئازادی، هونەر و ئەوین.

بەڕێزان!

ڕەنگە بەشی مە وابێ، شینمان بکەوێ بە سەر

شینا و دەرد بە سەر دەردا.......

هەڵبەجەکانمان بکەونە بەهار و کۆستی مەرگی

ئازیزانمان بکەون و بە سەر کۆستی هەڵبجەدا و ... تاد...

بەڵام با ئەوەش بڵێم کە قەت بەو بەشە رازی نەبووین و

بەردەوام هەوڵ و تەقەللا و جووڵانەوەمان هەبوە بەرە و

ئەو جیهانەی خۆمان چاوەڕوانین ... و بەو ئومیدەوە

زیندووین...

خۆشحاڵین بەوەی لاوانی تێگەیشتوو تێمان دەگەن و شوێنی
سوارانمان دەگرن ... بە هەڵبجە نائومیدنابن...
بەو هیوایەوە،
ئاسمان ئاواتتان درون و
کولچمی ژیانتان گەش بێ...
بە بۆنەی یادی هەڵەبجە و مارف و جەعفەر لە زانکۆی
هەمەدان لەگەڵ نامەیە و شێعرێک پێشکەش کرا.
هەزار دیوانی کەلەگەت لە پرسەدا
لەو سەرەمەرگە رەشەدا،
شێعری چی!؟
ملوێنێ وشەی سەر لە خۆم و
دەسراژەشین
ئەبنە دڵۆپیچک لە ئاوی کانیاوەکەم
بۆ سەر زاری سووتاوی کۆڵان و
قورگی گوڵ و
هاواری چاوەڕوانی شار....!؟
پەخشانیش
بێت و بکرایتە باهۆزێک
هەناسەی مەرگی رادەیەت...
رەنگە
ئەنا،

کام لقە سووتاوی مێژووم

بە دوو چەپڵە و

سێ«بژی» و

کورتە شێعرێک...

سەر لە نوێ هاتۆتە سەما!؟

کامە وێنە

هەزار «بووکی ئاوایی» می

لە قوڕگی سووتان

دەرهێنا!؟

یا زامێکی گوڵاڵە گەزیزەی وەرزی

سەرهەڵدان و تێک ڕمانی

ئەم وڵاتەی بۆ هەڵپێچاین!؟

هەست ڕێبەران!!

خۆ ئەزانم،

کۆڵ وکۆی زووخاوەکانتان

لە چەند رەنگن!

هەمووی مەیلە و رەش و شین و وەنەوشەیین...

ئەوەش نەکەن،

رەنگە تاشەبەردی سینگتان

شەقار بە سێ...

یا ئەونەیتر

دار بکوژرێ و

گوڵ سەربڕێیت...

بەڵام چی بکەین!؟

هەزار دیوانی کەڵەگەت

لە سەر گڵکۆی کێژی دەزگیران وەخوێنین...

دڵی دایکە رەشپۆشەکەی

ئەکرێتەوە!؟

گورگی هار ئەسڵەمێتەوە!؟

ئەی چی بکەین، بۆ خاتری خوا؟

ئەم قەڵەمە مل باریکە

چۆن بکەینە

چەکی هیوا!؟

باوکم ئەیوت:

باوکم ئەیگوت:

«ئەو ساڵەئەوان» «رەشۆکی» و

ئێمەش،

بە هەرشتێکی وا...

خۆمان بە خومانمان دۆڕان...

ئێستا

منم بە «بیگەرد»ەم ئەڵێمەوە:

ئەوان گڕی کیمیایی..

ئێمە بە هەمان قالۆرە چەکی...

هیوا!!

جۆگرەکەی «قەلاتان»م تا....

..........ئاگری «هەڵەبشیما» و

سی و سێ گوللە............

با ئێمەش هەر

سەنتوو لێ دەین...

وێنەی کچێکی مل لار و

شێعرێکی

یا دیوانێکی کەڵەگەت

بهۆنینەوە...

گورگیش

ئازابی ددان و

چنگی پۆلای بداتەوە...

بیر لە خوێنی گەرم و جەرگی

مەرێکی گێژ

بکاتەوە؟؟!!

رەشەمەی ٧٢

ئەم شێعرە لەشەوە شێعری بۆ یادی هەڵەبجە ٢١/١/ ٧٣ لە زانکوی تەبریز پێشکەش کرا.

هەروەها لە کتێبی هەڵەبجە (بنیاد هەڵەبجە)دا بە هێندی هەڵەی چاپییەوە!! لە چاپ دریاوە.

من هەواڵێکی تاڵ

دێینە بەر پەنجەرەکە

بارن بە خوڕدە

با

ر

ی

چۆمی زێڕینی قژیش

لە سەر چاوەی پەنجەرەی ماڵتانەوە

دێنە باوەش خەونەوە...

ـ ئەم بارانە،

ئەو کێوانە...

ئەم دەشتە...

سەر چاوەی ئەم ئەوینەن

ئەتۆش وەك خۆرەتاوی!

کە چاویان پیا نەگێڕی،

بارانەکە سەر لەنوێ

ئابێتەوە بە باران

کێویش دڵی ئەتۆقێ!

..........

ـگورانیە شێعرەکانت لە کوێن؟

ئەوەنییە بارانە؟!

...........

ـلەگەڵبادا دەهاتی ...

شێعرنامەی دیدارت

ئەدایە دەستی دەرکە...

کە بۆنیچکی پیاوانە

بە پێ دزکێ دەهات و

خۆی دەپرژانە سینگم..

لام وابوو خواوەندێک

هەر دوو دەستی دەگرتم

بەرەو قەراخ «وڵی خان»

دڵی هەڵدەفڕاندم...

...........

ـئەوەنییە بارانە؟

ئەی بۆبۆنی شێعرەکەت

نائالێتە ژوورەکەم؟

من سێبەری سەر تۆم

تا.........

......هەتا...

لە بەر چاوە!

باران نم

نم

دەبارێ

ئەتۆش ئەتوت:هەر ئێساکە

بە هەزاران مەلایەکەی ریش سپی

تەماشای ئەم ماچەمان ئەکەن!

گوێیان لەم راموسانەیە..

ـ ئەوانیش ئەویندارن

ئەشا چلۆن ئالان

بە ناوقەد ئەو دڵۆپە بارانەدا...

کەچی هەرچی هەوڵ ئەدەن

لە ئاسمان نەبێتەوە

دڵبەرێی بەنازە

وەڵامیان ناداتەوە....

ـباران بە خوڕ

ڕ

ڕ

ئەباری

من و ئەو گوڵانە و تۆ

تێکەڵ دەشتە کە ببووین

ئەتوت:

چاو!«تەپی ماڵان»

گوێی بۆ خەندەت تیژ کردوە!

ـ دەڵێی گەڕی دڵدارە...
بڕوانە کە چۆن چۆنی
چاوی بڕیوەتە «وەنەوشە»
ئێستێ باران
دەبارێ...
تەپی ماڵان دیارە...
تویش بوویتە تە هەناسەم،
ئەوەندەم هەڵمژیوی
قەت لیچم جیا نابیتەوە!
قەت لێم جیا نابێتەوە!
.........
ـ ڕۆژی هەواڵێکی تاڵ
بە شەق دابووی لە دەرکە
دایکم قوڵی گرتبوو
هاوردی بۆ ژوورەکەم...
ئێستا من و ئەو دەنگە
لەگەڵ ئەمژوورە ئەژین..
منیش
هەتا ئێوارە
دیمە بەر پەنجەرەکە
٧٢/٣/٩

سەما

سەما شێتی یەکیەتی بوو..

پەنجەی هیوای لە لا خوا بوو..

ئەبوو بە ئاسک

لە جێ ژوانا

خۆی پیشانی «خەج و سیامەند»ان ئەدا...

بۆ وەی پێکەوە بیدوێنن...

ئەبوە خاسەکەوێ مەلەنگ

بۆ وهی دەیان لاوی شەیدا

وە دووی کەون...

سەما کچ بوو

حەژی لە کوڕی قوز ئەکرد

ئاخی خۆزگەی دەمی کوڕبوو

گەرم وەك گر»

راستان ئەوێ

سەماش وەك هەمووومان وابوو

حەزی لە شیچعری گنالی» بووچ

لەگەڵ هەوای تەلی تاری شێعری

نەرمی مەولەوىدا

ببو بە دۆست ...

نامەی دەنارد

بۆ شێعرە تووڕەکانی «شێرکۆ»

بۆ قەڵەمە شەیداکەی من...

تەنانەت لەم دواییەدا

سەمای سیمای لە شیعر ئەچوو

راستتر بڵێیم

سەما «کورۆمۆزۆمێ» بوو

ئاڵا بوە «ژنێتیچکی»هونەرمەندان

رەنگە دیسان،

سەما بێتەوە بە ئاسک...

بەکەو

بە کچ

بە شیعر...

یا لەسەررا

خۆی بکاتە وێنەیەکی دەستی «مەسعوود»

٧٢/٦/٣١

پێشکەشە بە سەماویچنەکانی هونەرمەندی

کورد«مەسعوود رەحیمی»کە وێنەکانی سەرچاوەی رووباری

ئەم شێعرەم بوون.

لە بیرمەکە ژیلای جوانەمەرگ ئەم شێعرەی خوێندەوە لە

ژێرەکەیدا نووسی «منیش سەما»

کێ زۆرتر خۆری خۆش ئەوێ؟

شێعرەکانم،

کچی دڵمن

دڵی دەریا...

بیرم،

هەورێ گرژ و تووڕە

ئاشقی بای بەرە و دارستانو

چیا...

بۆیە کە خۆر چاو هەڵدێنێ

هەوەڵ ئەڕوانیتە کێو و

ئێنجا دەریا...

کێ زۆرتر خۆری خۆش ئەوێ؟

من یا کچەکانی دەریا

من یا«کچەکانی دەریا»

کێ زۆرتر  خوری خوش ئەوێ؟

من یا کچەکانی دەریا

من

یا

کوڕەکانی چیا؟

ـ «دخترهای ننه دریا» ناوی شێعرێکی شاعییری بەناوبانگی

فارس «احمد شاملو»ە

مانگ بوون

لە نێوانی شەوەزەنگ و

ڕۆژی ڕوونا

مانگ بوون،

یاری کردنێکە بە ڕۆحی شەو...

بە گیانی ڕۆژ...

مانگ بوون،

دوو دەستی گەرەکە

درێژ تا ڕۆژ

درێژ تا شەو...

مانگ بە سەر پای شەو و

ڕۆژەوە

دەوەستێ

مانگ بوون سەختە

مانگ بوون یانی،

دان نان بەسەر حەقیقەتی شوومی

شەوا...

مانگ بوون یانی

هەتا ئەبەد...

چاوەڕوانی هەتاو کردن...

لە نێوانی شەوزەنگ و

رۆژی روونا

مانگ بوون سەختە

شەو پەرەست

یا

هەتاو پەرەست

ئەو رەنگانەی دێن دڵمان ئەکەنەوە

چاوەکانت،

لە رەنگی لێرەوارن!

نیگاکانت،

سێ رەنگەکەی ئەوینن!

منیش،

تەم و مژێکی سەر لە لێشیواو...

بە شوێن خۆر و

جەنگەڵەکەی ئەوینا

دێم و

دەچم ...

قوفڵەی دڵە ی برینم

ئەی هەتاوە ژەنگاویەکەی ئەم بەهارە زستانە

بۆ کرووزی ئاخێکم

بۆناگاتە گوێی پرشنگی هەناسەت!؟

ئەی جەنگەڵە توزاویەکەی بریندار!

سۆزی شێعرم

بۆنابەسی بە لقێکی ئەشقەوە؟!

نیگاکانی،

رەنگاورەنگی ئەوینن

دێن

دڵمان ئەکەنەوە،..

٧٢/٩/٢٥

ـ لە ئێوارە شیعری خوێندکارانی «علوم پڑشکی» لە زانکوی

سنە بۆ خوێندکاران خوێندرایەوە.

ئازار

پێوانەی ئازار چەندە گەورەیە؟

ئ..ا..زا...ر..

هیچ ئاسمانێ ئایگرێ

ئا...زا...ر

ئەقیانووسی شێعر چەندە بەرینە؟

چاو هەتا هەتەر...

کەچی کە دێ،

وشە, نیە،

زووخاو جەرگی نەخورادبێ

دێڕم نیە

سیەکانی لیپاولیپ نەبێ

«لە کەر بوونی»ئاخ..

خوا و خەڵك و شەهید ئەزانن

چۆن پێنووسم

کەوانی دەستی «ئرووس»ە

نفرهتیشم

تیرێ زێڕین...

هەموو کچە دەزگیرانێکم ئەزانن

رۆژی نەبووە

زاڵم نەكەم بە نیشانە و

نائومێدی،

نەدەمە بەر شەقی وشەم...

ئەی ئەم خوێڕیە چۆن ئێستە

چنگی ناوەتە بین تیر و كەوانەكەم!؟

لەوانەیە

دەزگیرانە شەنگەكانیشم هەڵلووشێ...

چۆن نەهێڵم؟

اچۆن خۆم نەدەم بهدەمیەوە؟

جاران شەواوشەو ئەهات و

بەر پەنجەرەكەی دەگرت و

لوورە... لوور... و لوورە...لوور..

منیش

شێعرێك و

خەیاڵی كچی جوانم تێدەگرت

ئێستا

دوو ئەونە، نا، سێ چوار،هەزار...

ئەوەندە دەبێ

شێركەڵپەی درێژ

وەك «تاناتووس»ە

شێعرم دەجوێ و

دەفتەرەکانم هەڵمەقووت...

واز لە نامە دلچداریەکانیشم ناهێنێ

تەنانەت یادی شەهێن و پەری و نازی و...

ئەخواتەوە...

چۆن خۆم نەدەم بە دەمیەوە؟

ئەمشەو وتم

چی باڵندە بە چیاوە

چی کچی جوان لەشارایە

بێنە شێعرێکم...

هەریەکەو دێرێ دڵداریەکانم ئەکەمەملیان

با تێر هەڵپەڕن...

منیش،

تیرێکی زێڕینی شێعر ئەخەمە کەوان

رووە و برای شەو

١ـ «ئرووس» (Eros) خوای لایەنگری ئەشق کە بە تیروکەوانە زێڕینەکەی تەنگ و چەڵەمەی سەر رێگەی ئەشق ئەپێکی.

٢ـ «تاناتووس»(Tanatos) برای خەو و کوڕی شەو(هەر هیزێ بتوانێ دەسەڵاتی ژیان لاواز کا)

تۆی گوڵی ڕەش

ئاخ...

کەچەکی دەستی راستم

خەنجەرەکەی دەستی چەپمی نیشانە بێ

قوڕ بە سەرم

کوا وڵاتم رزگار ئەبێ!؟

ئاخ..

کە مێژووی حەزلێکەری «سولێمانی» م

بە دەست کچی دل پڕ لە تاسەی هەڵەبجەم

ئەنجن و ونجڕبکریەت...

گوللەی تفی دنیا بۆمن

کوا وڵاتم رزگار ئەبێ؟!

رەنگاڵەی هیوای وڵاتم

سوور و زەرد و سەوزی ئەوین

نەحلەت لە من،

زەرد چۆن ئەبێ

سەوز بدڕێ!؟

شاعیرێکم

دڵی قەڵەم و دەفتەرم

چسەند پۆستاڵی رەش و چڵکن

رمبازێنیان ل سەری بێ ...

ئەی رووڕەشی دنیا بۆ من

چۆن شێعرێکم شێعرێکی ترم سەر بڕی؟!

کێ ئەناسن؟!

ئێوە و ئەوەی ئەیپەرستن!

(ئەگەر وەک من ولأتتان بێ)

لە مە زیاتر

با مێژووی حەز و تاسەمان

سەر شۆڕ نەبێ..!

دیسان، سواره و پەری خان

دەلیٚلیٚ... دەلیٚلیٚ... دەلیٚ لیٚ...

«بووکەخان»م لەدەست «نژدەی رمووزنانە»

لە کویێ «کوردۆ»ی شیٚعرم؟

لە کویێ؟

لە کویێ «چەتۆ»ی قەڵەم لە کویێ...؟

کوردۆ دەڵیٚ: ئیٚوارەیە

ئەوا شەومان بەسەرا دیٚ...

لە هەڵدیٚران دەگلین مەڕۆ!

چەك بە شەوا کویٚرە مەڕۆ!

ئەوان نژدەی ریشی درون

هەزار ...

هەزار

ئیمە وشەین،

نەرم و ناسك سوورین وەك بەژنی بووکەکان

ئاوی

وەك رۆحی بووکەخان!

مەڕۆ ... مەڕۆ...!

«قوشەنی نژدەی دژویٚن»

ریٚگەی چیایان بەستووە

هەر چوارلامان لیگیراوە..

تۆ بڵێی رۆژنەکاتەوە!؟

ـ بۆی هاواری بووکەخان دێ

ئەرۆم... ئەڕۆم!

ئەگەر گڵام...

شیعر با پیاما بخوێنێ...

هەوراز شینم بۆ بگێڕێ...

یا بووکەخان

یا هەڵدێران..

یا بووکەخان یا..

سوارەو

خەنجەر لە بە پشتوینەیدا ئەنەڕێنێ..

ئەسپی کوێتە لە ژێرپایا ئەحیلێنێ...

بەیت و باویش

لە سیمای «چەتۆ» و «کوردۆ»دا

بە شوێن ئەودا ئەچریکێنن،

دەلولۆ .. دەلۆلۆ... دەلۆلۆ

ئێمە دۆستی گیانی گیانین

ئەگەر پارچە پارچەشمان کەن

دیسانەوە لە سەر سوارەین..

دیسانەوە لەگەڵ سوارەین...

دیسانەوە

بووکەخانیش،

مێشێرێکی رق ئەستوورە

هەر دەستێکی

مشتێ ریشی هەلکرانراوی چەتەی تیایە

حیلەی ئەسپی شاسوارەکەی ئەیهەژێنێ

ئەقریشکێنێ

دەلۆلۆ... دەلۆلۆ... دەلۆلۆ

وەرەسوارۆ ... وەرە سوارۆ... وەرە سوارۆ

گەر تۆ نەیەیت،

ئەی چۆن ئەوین ببێ بە ئەفسانەی چیا

رووبار زوو زووبیلێتەوە..

دار بۆ چرۆی بگێرێتەوە...

گولاڵە سوورە لەسینگیا حەشاریدا.

بەهار...بەهار..

ببێتە چەپکەیەك دیاری

کورِبۆ کچی بباتەوە؟!

هۆ سوارە گیان!

شەوەزەنگە!

رمووزن چوار دەوریان داوم

بۆنی قینی تۆ ئەبیسم و

ناتبینم!

ڕەوەزێك ئەكەینە پەنا

یا ڕزگاری

یا لە سەرڕا

دەبینەوە بە ڕەوەزێك لە سەر چیا!

«چەتۆ» دیسان ئەچریكێنی،

هۆ سوارۆ... سوارۆ

ئێمە دۆستی گیانی گیانین

بە شوێنتەوەین...

سپای ریش و قوشەنی ڕەش

دەوریان داوین!

دەنگیان داوینەتە بەر تیر...

بە تۆ ناگەن!

كوردۆ دەڵێ،

ئەوین نامرێ!

بەیت و باویش،

لە سینگی ئەم چیایەدا قەت نابەزێ!

«كێ بە چیامان ئەوێرێ!؟

دارەبەڕوو. دۆستی گوێ سووك...

ئەویش كەی لەتەور ئەترسێ!؟

هۆ سوارۆ... سوارۆ ... سوارۆ...

بووكەخانیش،

دەلۆلۆ... دەلۆلۆ... دەلۆلۆ...

لە بەر حیلەی ئەسپت مرم!

بە قوربانی پێکەنین و تووڕەیی خەنجەرەکەت بم!

زوو کەوەرە!

با بۆ دوایین جاریش بووە

تێر بتبینم!

با بۆ دوایین جار...

با بۆ...

با...

ئەو وشە و دێرانەی لە «گیومە»دان لە ئەسڵی بەیتەکەوە وەرگیراوە.

ئێمەش دەبێ: هەر زووخاو...

ئەتانەوێ لە رۆچنی مانگە شێعرێکەوە

چی کچی جوانی و کوڕی قۆز و...

چی دڵداری و راموسانی شەوانەیە...

پیشانتان دەم!؟

یا لەپەنجەرەی خورەوە

شارۆچکەیەکتان پیشان دەم کە خەڵکەکەی

چی کۆڵان شەقام و خانوویان هەیە

میدالیای یەکەمینی خوای ئەشقیان لەملدا بێ و تف لە

یاسای شەوەزەنگ کەن!؟

چیتان ئەوێ!؟

شێعر و ئەشق و «ستاتیکیا»

ساڵهایە ...

دەست لە ملانن

(بۆتان... بۆتان...)

کامەبەرزیان،

ئەهاوردۆتە بەر دەمتان!؟

کامە دووریان

نەهێنایە چاڵی مستتان!؟

دەمست کەونەوە و ببینن!

ئێمە چی بکەین لە کوێریتان!؟

ناتانەوێ

زەماوەنی باوەگەورەی باوەگەورەی

دایک وباوکتان

لەشیعرێکا بخوێنەوە!؟

ناتانەوێ

دایەگەورەتان ببینن

لەو رۆژەوە ئەرز ئەیرێسی،

هەر ئەسوورێ و

چۆن دێ بە دەم باوکتانەوە!؟

(گوێ کپ مەکەن!

یا خوا کەڕبن!)

دەبیچێژن!

هەتا...هەتا...هەتا...هەیە

زووخاو ...

زوووخاوو...

زووووووخاووو...

زووووووخاوووو...

لێم زیز مەبن

ئەتانەوێ

لە ئاوێنەی شێعرێکەوە

شارۆچکەیەکتان پیشان بەم؟

چی دار و بەرد و چی گوڵ و مەلی هەیە
میداڵیای یەکەمینی خوای ئەشقیان لە ملدا بێ و
تف لە «یاسای دارستان»!؟
یا هەر دیسان
پێتان خوشە
نوقڵە شێعرێکتان دەمەدەست
بیمژن و
بیر لە لێو و سەر و سینگی خاتووزین و
دەست و پەنجەی
کچە جوانەکەی «کافرۆش» بکەنەوە!؟
چیتان ئەوێ!؟
(لێم زیز مەبن!)
بێن لە پەنجەرەی شێعرەوە
بڕوانینە شارۆچکەیەک
کە منداڵ و بووکە شووشە
بۆ«گوڵ و پەپوولە»
ئەگر
ر
ر
ر
ین

ئەم شێعرە لەئێوارە شێعریێ بو هەڵەبجە و مارف و جەعفەر
لەگەڵ «نامەیەکڤ بۆ خوێندکارانخوێندرایەوە هەروەها
لەئاویەری ژمارە تایبەتی هەڵبجەدا (١٣٧٦) بڵاو کرایەوە.

ئەمجارەیان «ئیسپارتاکووس» سەرئەکەوێ

ئەم جیهانە،

هەرئەم

ر

ر

ر

و

و

و

خێ و

باسکی منە ئەیکاتەوە

بە سەدەی نوێ

لێرەوە تا حەوشی «میتسۆبیشی»

لەوێوە،

تا دەروازەکانی«بانگ»ە قەت

تێر نەبووەکان

تا کارگاکانی جراڵدفۆرد و

ئەفریقای قولەڕەشە...

هەر ئێمەی هاوەڵی «سپارتاکووسین»

بە چوارمێخەی چنگی

کارتێلکەکانی دەسەڵاتا

هه

ڵوا

سرا

وین

«فەقێ تەیران» تا ما

خوێندی

«خانی»شەڕەقەڵەمی کرد

«گلسرخی» و «سلگانپور»یش

ئێعدام کران

«بەرۆژ»یش حەوسەڵەی نەماوە

بەڵام خونچەکانی کوردسان

کرانەوە...

لەئیسپاتاکووسەوەتا...

...«بابی سانز»

زێری کاریان ئەدەینێ

بە بۆقە مردوویەک..

ناشبێ نەمامی هیچ پرسیارێ

بچەقێنین

بۆ!؟

لە ئیسپارتاکووسەوە... تا

بابی سانز

دەكوژرێین و

لەئیسپاتاكووسەوەتا.....

..................ئاپۆ

زیندووین...

بە چەپۆلی اهوارە قنگ رووتەكانیان

رامان ئەدەن

بە شوكولاتە سێكسیەكانیان

فریو..

ئەمجار زۆرین

چوار مێخەكان بەشمان ناكا..

مەگەر جیهانێكی بەشكۆ سازكەین

ئەمجارەیان

ئیسپارتاكووس

سەر ئەكەوێ

٧٣/٣/٢١

(١) لە شێعرێكی بە رۆژئاكرەیی خۆیەوە وەرگیراوە.

سرووديَك

كيَ ئەيزانيَ مەلينە

ئاوا ئەتانتاريَنن

باڵى هەزارتان ئەبڕن

شاريَكتا ئەخنكيَنن!؟

كيَ ئەيزانى بەهاريش

شەختا و زريان ئەهيَنيَ

چاوى ليَمان دائەخا

چرۆكان ئەوەريَنيَ!؟

بۆنى شەماڵ ببيَتە

بۆگەنيَكى ناشيرين

گوڵ بهيَنيتە كۆكە

دار بهيَنيَتە لە رزين!؟

تەناف هەڵخەن بۆ شاريَ

دەستى شەقاميش ببڕن

كۆلآن بدەن لە داريَ!؟

لاويَكى شەرمەون بووم

ميَشكم ئەدرا بە ماران

ئيَستا كە پير ماندووم

دەرم ئەكەن لەشاران!!

كيَ ئەيزانى كە رۆژيَ

من ئەکرێمە گۆرانی
دەمەو بەهار دێمەوە
دەمەو بەهار دێمەوە
دەچمە ناو ئاوی کانی
گەرووم بە گزنگ تەڕکەن
زامەکانم بە شیلان
بە گورانی دامپۆشن
یا بە سەوزی دارستان»

١و٢ـ لە شێعری لاوکی هەڵەبجەی «رفییق سابیر»وەرگیراوە، بە هێندێ دەستکارییەوە
لە لایەن عەزیز سەیفی، عەلی عابیدی ، ئەنوەر قەرەداخی‌یەوە،ئاهەنگی بۆ دانراوە و بە دەنگی زۆر لە دەنگ خۆشانی کوردەواری گوتراوە/هێدی ، تارا رەسووڵ ـ عابیدی ـ مەریوان سەفەدین.../

هاڕین

هەر هاڕیمیان...

هەر هاڕیمیان...

هەر...

تا ....زیخ

تا چۆم هێزی تیا بێ

ئەڕۆم ...

کەنا...

دەبم بە چووکترین بەردی

وڵات

٧٤/٤/١

«نامە»

لەلاپەڕەی گۆڤارێکا

گوێمان دایە چاوی یەک

تۆ گلەییت لە «چەقۆ» بوو...

منیش نفرەتم لە مقەست...

ئێستا

پەڕەی گۆڤارێکی مێژووییە

بۆ شێعر تێک نەئاڵێنین؟

دەنگ... نیگا...

چەقۆ... مقەست...

من تۆ من تۆ من تۆ...

ئەم کەڵەشێرە نووستوە

کەی ئەخوێنێ!؟

٧٤/٤/٢٤

هەرسێ تیر

«هەر ئەتوانم سێ تیر بخەم

گەر نەپێکم

ئەبم بە بەرد!

دوو تیری خۆم هاوێشتووە

تۆ قاقا پێم پێکەنی و

تا سینگم بەرد

رازی ژیان لەلایەک و

نهێنی مەرگ لەلایەک

من و

تاقە تیرێک و

تا سینگم بەرد

«ژیان یا مەرگ»!؟

مەرگ یا ژیان!؟

ژیانی قژ ئاڵتوونی

که بییر له مەرگ ئەکەمەوە

قژی له بەنیٚ چەرمگ و

چاوی ئاڵای نائومێدی و

لووتی پڕە له بەنیٚ رەش

کەبیر له مەرگ ئەکەمەوە

گورگ کەڵپەی تیژ...

لیک تا  ئەژنۆ...

گوێی عەرەبی ئهبیسیٚ و بەس

دەستی پڕە له بیکاری و

دابەشی ئەکا...

سینگی هەمارە پوی نفرەت...

به سهر دوو چڵەچیلکەی ناڕاستەوە

دەوەستیٚ

خەندە و گریان ئەبۆڵێنیٚ...

که بیر لەتۆش ئەکەمەوە،

ئەی ژیانی قژ قەترانی

باسک سفتی چواردەساڵە

بۆنی ئەشق ئەداتەوە

لووتکەی سینگت...

بەرەو بەرزی هەڵمەکێشی

دەنگی «گولستان» ئاسایی

پێکەنینت...

باوشت پڕن لە خوزگە

لێویشت وەک نوقڵی تاسە...

سروودی خۆر ئەچریکێنن

کە بیر لە تۆ دەکەمەوە

بە سەر دو جەمسەری دنیاوە

وە

ستا

وی

ئاڵای سووری خۆشەویستتت بو

هەڵدا

و

ین

قەت بیر لە مەرگ ناکەمەوە!

کە بیر لە ئەشق ئەکەمەوە

ئەی ژیانی قژ ئاڵتوونی...

قژ قەترانی...

قژ خەنەیی...

بیری مردن ئەخنکێنی

حەزی دڵم...

ئاوارەیی لە بەژنی دایکم ئاڵابوو:
کات درەنگ بوو
«سلیمانی» چارشێوێکی رەش و سووری
لە سەردا بوو...
چاوی هیوای بڕیبوە لووتکەی قەندیل
کەنیشکێکی چاو رەشم دی
قژی لە پرچی قەندیل ئەخشا
(هیند بڵیند بوو)
منیش وتم:
ئەی خو قەزای سلێمانی
بۆ چاو جوانی!
لاوێکی چاو و برۆرەش
هەر وەک «سۆراب»
ئاوزەنگی لە ئەسپی کات ئەدا...
بەرەو کوێستان
شەوی ئەدڕی
وتیان کوڕی خەجێ شێرە
لە کولاّنی سووریکەرکووک
بۆ نۆ جوانی!
ئاوارەیی لە بەژنی دایکم ئالاّ بوو
لەپڕدەنگی لەبەرزایی کوێستان ئالاّ

ـ ئەم شەڕەمان و نەمانە!

یا پێشمەرگە و

چیا و

کانی...

سولێمانی و کەرکووك وگشت و شارەکانی

یانەمان و

کورد قڕان و

«صدام» وانی ...

شێر بوو پلینگ بوو ... نەمزانی

شاڵاوی گڕ لە دەنگی ئەتکا

وتیان ئەوە پێشمەرگەیە

شەهێنی ئاسمانی مەیە

وتم قەزای کوردستان!

لە شەوە شێعری بۆ ئاوارەکانی کوردستانی عیراق لە شاری سنە ١٣٦٩خوێنرایەوە. بە دەنگی دەنگی خوش «کامران عومەر» بە مەقام تۆمار کراوە.

## گریلا

تیشکی زێڕینی بەیانن

وم بە دەست و

شیر لە شان

پارتیزانن ... پارتیزان...

پارتیزانن ... پارتیزان...

گریلا سپای هەتاون

تاوی تاون

تاونەتاوێ دێنە

خوار...

پارتیزانن...پارتیزان...

پارتیزانن ... پارتیزان...

جەنگەڵی هزری بیدارن

پشت بە پشت و

شان بە شان

پارتیزانن...پارتیزان...

پارتیزانن ... پارتیزان...